# ماسیەکە بوو بەبۆق



نووسین و سیناریۆ: ئاشتی ڕەحمان
نیگار: پەخشان گەلاڵی





# ژیانی بەفێڵ و تەڵەکەبازی تەمەنێکی کورتی بەدواوەیە



نووسینی: عەزیز هەریری
نیگار: بەختیار ئیسماعیل جاف

ڕۆژێکیان ڕێوییە بچکۆلانەکە، کە سەیری دیواری ماڵەوەیان دەکات، لەپڕ دەبینێ سێ کەوڵی جودا جودا بەدیوارەکەوە هەڵواسراون، کەوڵی یەکەمیان؛ هی شێرەو، دووەمیان؛ هی پڵنگەو، سێیەمیان؛ هی ئاسکە کێوییە، هەرزوو ڕوو لە باوکی دەکات و لێی دەپرسێ: « باوکەگیان؛ ئای کەئازایت، پێم ناڵێی ئەم هەموو گیاندارانەت چۆن ڕاوکردوون، بەتایبەتیش شێرو پڵنگەکە؟!» .

– باوکی زەردەخەنەیەک دای دەگرێ و دەڵێت:

« ڕۆڵە ئازیزەکەم؛ ئەوەی ڕاستی بێت من ئەم گیاندارانەم بە فێڵ و حیلەبازی ڕاوکردوون، نەک بە ئازایەتیی خۆم؛ دەگوێ بگرە تا بۆتی باس بکەم» :

– ئەم دوو کەوڵەی شێرو پڵنگەکە، کە بەدیوارەوە هەڵواسراون، جارێکیان ئەم شێرو پڵنگە کە هێشتا ساغ بوون هەڵمخەڵەتاندن و وام لێکردن پێشبڕکێ بکەن بۆ ئەوەی ئاسکە کێوییەکە ڕاوبکەن، زۆری نەبرد بەدووان ئاسکە کێوییەکەیان گرت و کەوتنەگیانی و خواردیان؛ بەڵام هەر زوو شێرو پڵنگەکە لەسەر گۆشتخواردن بوو بەشەڕیان، جا چ شەڕێک؛ نەوەستان تاوەکو یەکترییان کوشت، ئەوسا منیش دوای شەڕەکەی ئەوان مەیدانم بۆ چۆڵ بوو و بۆخۆم کەوتمە گیانی ئاسکە کێوییەکە تاوەکو هەموو گۆشتەکەیم خوارد، بۆ ڕۆژی دووەم و دواتریش گۆشتی شێرو پڵنگەیشم خوارد؛ ئینجا بەم سێ کەوڵەو سکێکی تێرو کەللەیەکی پڕ فێڵ و تەڵەکەبازی و دوور لە ئازایەتی گەڕامەوە ماڵەکەی خۆمان.

* ڕۆڵە شیرینەکەم؛ ئەی گوایە نەتزانیوە، کەڕێوی ئەمەکارو کردەوەیانەو هەمیشە بە فێڵ و تەڵەکەبازی ژیان دەگوزەرێنن؛ نەک بە ئازایەتی و شایستەیی و لێهاتووییەوە، هەر بۆیەشە کە تەمەنمان کورتە.

بەهەرحاڵ هیواخوازی ئەوەم تۆ ئەم ڕێبازەی ئێمە نەگری و ڕوو لە کاروکردەوەی چاک بکەیت و ڕێز لەهەموو گیاندارانی ئەم دارستانە بگری و هەموویانت خۆش بوێن؛ چونکە سەرکەوتن و تەمەن درێژی بەکاروپیشەی چاک بەدی دێت..



# یەشار کەمال

ئا: کافیار سەلیم
نیگار: دارا محەمەد عەلی

یەشار کەمال ڕۆماننووسێکی بەڕەسەن کوردی تورکیایە، لەساڵی ١٩٢٣ ی زایینی لەبنەماڵەیەکی جووتیاری گوندێکی نزیک دەریاچەی (وان) لەدایک بووەو پاشان بەهۆی شەڕی نێوان ڕووس و تورکەکان بەرەو دەڤەری (چوکوراڤا)ی شاری (ئەدەنە) کۆچیان کردووەو لەگوندی (گۆگجەلی) نیشتەجێ بوون.

ئێستا تەمەنی یەشار کەمال ٨٠ ساڵەو لەوڵاتی (سوید) پەنابەرە، یادەوەرییە شیرین و تاڵەکانی سەردەمی منداڵیی لەنێو ڕۆمانەکانیدا ڕەنگیان داوەتەوە.

یەشار لەسەردەمی منداڵیی خۆیدا زۆر بە (عەڤداڵی زەینکێ) کاریگەر بووە کەبەیتبێژێکی لێهاتوو بووەو شەوان چیرۆکی خۆشی کوردەواریی بۆ گێڕاوەتەوە.

یەشار کەمال بەهۆی قەدەغەکردنی زمانی کوردی لەتورکیا ناچاربووە نووسین و ڕۆمانەکانی بەزمانی تورکی بنووسێ، بەڵام ئەو ڕژێمە نەیتوانیوە بیروهەستی کوردایەتی لەیەشار بسێنێتەوەو سەرجەم نووسینەکانی ئەو نووسەرە گەورەیە لەدابونەریت و خۆشی و ناخۆشیی ژیانی کوردەواری دەدوێ.

یەشار کەمال تا ئێستا ٢٠ کۆمەڵە چیرۆک و ٢٠ ڕۆمانی نووسیوە کە زۆربەیان بۆ زمانە زیندووەکانی جیهان وەرگێردراون، لەوانە: حەمەدۆک، کاریتە یان ئەودیوی چیا، زەوی سەخت و ئاسمان مس، سێ ئەفسانەی ئەنادۆڵی، مارەکەیان بکوشتایەو چەندین بەرهەمی تریش.

یەشار کەمال جیهانی منداڵانیشی بەسەرکردووەتەوە (پادشای فیل و مێرووڵە شەلەی ریش سوور)ی بۆ منداڵان نووسیوە.

ئەمەو هەندێک لەو بەرهەمانەی یەشار کەمال بۆ زمانی کوردیش وەرگێردراون.

# گرنگیی کتێبخانەی قوتابخانەکان




نووسینی: حەبیب عەبۆ برایمۆک
نیگار: دڵشاد عەلی

ئازادو ئاواز دوو قـوتابیی ڕێکوپێک بوون، لەکـاتی پشـوودا لەگـۆڕەپانی قـوتابخانە هاتوچۆیان دەکـرد، لەناکـاو ئاواز بەئازادی هاوڕێی گوت: ئای.. ئای ... ئازاد، ئەم دیوارە پەخشنامەیەکی نوێی پێدا هەڵواسراوە!

بابچین بزانین چی تێدا نووسراوە! بێگومـان قـوتابییـەکانی پۆلی شەشەم بەسەرپەرشتی مامۆستایانی زمان دەریانکردووە.

ئازادیش وەڵامی دایەوە: وایە .. کـەواتە زووکـە، باپێش ئەوەی زەنگی چوونە ژوورەوە لێ بدات بچین تەماشای بکەین.

وەک دوو پەپوولەی ڕەنگاوڕەنگ، یان وەک دوو هەنگ چوونە بەردەمی پەخشنامەکە، ئاواز بەوردی سەیری بابەتەکانی کردو پاشان بەزەردەخەنەوە گوتی: بڕوانە بابەتەکانی چەند خۆش و بەسوودن! بەڵێن بێ لەپشووەکانی تر گشت بابەت و گۆشەکان بخوێنمەوە، دەستی دەستەی دەرکردنی خۆش بێت.

ئازادیش بەگەرمییەوە گوتی: ئەم نووسینە باشانە نیشانەی بایەخدان و بەهرەدارین، سەرپەرشتیی مامۆستایانیش هاندەرێکی گرنگە بۆ ئەم کارە پەروەردەییە.

دوایی ئاواز بە پەنجە ئاماژەی بۆ گۆشەی کتێبخانە کردو گوتی: کاکە ئازاد بڕوانە چی لەم گۆشەیەدا نووسراوە؟

ئازادیش زوو وتەکەی خوێندەوە: (کتێبخانە سەرچاوەی زانست و ڕۆشنبیرییەو مامۆستایەکی بەردەوامیشە لەژیانماندا).

پاشان گوتی: بۆیە مامۆستاکان دەڵێن پێویستە قوتابی لە هەموو دەرفەتێکدا سوود لە کتێبخانەی قوتابخانە وەربگرێت؛ چونکە هاندەرێکی گرنگە بۆ پەرەپێدانی خوێندن و گەشەدان بە بیری مرۆڤ.

ئاوازیش پاڵپشتی قسەکانی کردو گوتی: لەوانەی زمانی کوردیدا مامۆستا هەندێک بابەتی خۆشی گۆڤاری (هەنگ)ی بۆ خوێندینەوە، بەڕاستی هەموومان سوودمان لێ وەرگرت، خۆ ئەگەر هەوڵ بدەین خۆشمان بۆ خۆمان بخوێنینەوە؛ ئەوا زیاتر سوودمەند دەبین.

لەوکاتەدا زەنگ لێدراو هەردووکیان بەرەو پۆل ڕۆیشتن.

ئا: نسار موکەڕەم

نیگار: پەیام شاهین

7

# مانگی دەستکرد



منداڵە ژیکەڵەکان:

هەمووتان دەزانن کە مانگێکی سروشتی هەیە تیشک لەخۆر وەردەگرێت و شەوان گۆی زەوی ڕووناک دەکاتەوە... بەڵام ئێستا زانست تاڕادەیەکی وا پێشکەوتووەو مرۆڤ توانیویەتی بەهۆی مووشەکەوە ئامێری زانستی بەرەو ئاسمان هەڵبدات، کە بەدەوری زەویدا دەسووڕێتەوەو ناوی (مانگی دەستکرد)ی لێ نراوە.

جا ئێستا بە سەدان مانگی دەستکرد لەبەرزایی جۆراوجۆرەوە بە دەوری زەویدا دەسووڕێنەوەو خێرایيان ئەوەندەی خێرایی زەوی دەبێت یان زۆرتر.

لەومانگە دەستکردانە هەیانە بۆ گواستنەوەی بەرنامەکانی تەلەفزیۆن بەکاردێت و هەیانە بۆ وێنەگرتنی پێوەندیدار بەلێکۆڵینەوەی کەشوهەواو زانینی پلەی گەرماو ڕوودانی گەردەلوول و باران و بەفر بەکاردێت و هەیانە بۆ دابینکردنی تەلەفۆن و پێوەندیی دوورمەودا بەکاردێت.

هەربە هۆی ئەومانگە دەستکردانەوەیە ئێستا دەتوانین لەڕێگەی ئامێری سەتەلایتەوە کەناڵی جۆراوجۆری تەلەفزیۆنی وڵاتە دوورەکان و وڵاتانی باکوورو باشوورو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا وەربگرین و تەماشای بەرنامەکانیان بکەین.

هەربە هۆی ئەومانگە دەستکردانەوە دەتوانین لەڕێگەی کۆمپیوتەرەوە سوود لەخزمەتگوزاریی ئەنتەرنێت وەربگرین و ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی وڵاتە دوورەکان بخوێنینەوەو گوێ لەڕادیۆ ڕابگرین و سەیری بەرنامەکانی تەلەفزیۆن بکەین.

کەواتە مانگی دەستکرد دەتوانێت ژمارەیەکی زۆر کەناڵی تەلەفزیۆنی و تەلەفۆنمان لەیەک کاتدا بۆ بگوازێتەوەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بەیەکەوە ببەستێتەوەو ئەو جیهانە گەورەیە بکاتە گوندێکی بچووک کەمرۆڤ ئاگای لەهەموو ڕووداوەکانی بێت.

٨

# دەرمانی ژانەسەر



نووسینی: ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل        نیگار: مەریوان گەلالی

ورچێک سێ بەچکەی هەبوو، لەناوەڕاستی دارستانێکی چڕدا لانەیەکیان بۆ خۆیان پێکەوەنابوو، ڕۆژ تا ئێوارە ئەم بن دارو ئەو بن داریان دەکردو میوەی خۆش خۆشیان دەخوارد، هەنگوینی ناو دارانیان دەردەهێنا.

ڕۆژێکیان ورچەکە لەگەرمەی گەڕانێکدا بەناو دارستانەکەدا هەستی بەژانەسەر کردو نەیتوانی گەشتەکەی تەواو بکات، بەلۆژەلۆژ بۆ لانەکەی گەڕایەوە.. بەچکەکانی ماندوو نەبوونیان لێکرد، بەڵام ئەم وەکو ڕۆژانی تر ماچی نەکردن، لەولایانەوە لە سووچێکی لانەکەدا بەبێتاقەتی پاڵیدایەوە، بەچکەکانی لێی نزیک بوونەوە، بەڵام ئەو هەر هاواری لەسەر دەکردن.. هەرسێکیان بەیەک دەنگ گوتیان: هەرچی تۆ دەیڵێیی ئێمە ئامادەین بیکەین بۆ ئەوەی ئەم ژانەسەرەت نەمێنێ.

ئەویش پێی گوتن: هەریەکەتان بەلایەکدا بڕوات، بزانم کامتان دەرمانی ئەم ژانەسەرەی من دەدۆزنەوە؟

سێ بەچکەکە کەوتنەخۆو هەریەکەیان بەلایەکدا ملی نا. زۆری پێ نەچوو بەچکەی یەکەم بەجامێک هەنگوینەوە خۆی بە لانەکەدا کردو گوتی: ئەم هەنگوینە نایابە بخۆ چاک دەبیتەوە.

بەڵام ورچەکە هەندێک لەمەوبەر تاتوانیبووی هەنگوینی خواردبوو، بۆیە سەری ڕاوەشاندو لێی وەرنەگرت. لەم بگرەو بەردەیەدا بوون بەچکەی دووەم خۆی بەژووردا کردو گوتی:

- ئەمە دەرمانی تۆیە.
- باشە چیت هێناوەتەوە؟
- شیلەی میوەی گەییوی دوورترین جێگای دارستانەکەم بۆ هێناوی

بەپێکەنینەوە گوتی: هەرگیز لە هەنگوین شیرینترو خۆشترنییە.



دەمەو ئێوارە بەچکەی سێیەم گەڕایەوە، جانتایەکی بەملدا کردبوو، هاتە ژوور سەری.

- ها.. بزانم تۆچیت پێیە؟

بەچکەی سێیەم لەسەرخۆ گوتی:

- بەدارستانەکەدا دەگەڕام، بیرم لە ژانەسەرەکەی تۆ دەکردەوە، لەبن دارێکدا چەند کتێبێکم دۆزییەوە، دەستم بەخوێندنەوەیان کرد... باسی بەکەڵک و قسەی خۆش و ئامۆژگاریی بەنرخیان تێدابوو، منیش پێنووسەکەم دەرهێناو زۆربەیانم نووسییەوەو چەند کتێبێکیشم لەگەڵ خۆمدا هێناوەتەوە، با بۆتی بخوێنمەوە.

ورچەکە بڕوای نەبوو بەمە چاک بێتەوە، بەڵام بەناچاری و نابەدڵی گوتی:

- دەی بزانم.

بەچکەی سێیەم دەستی کرد بەگێڕانەوەی ناواخنی کتێبەکان.. باسی ڕاوچییەکان و بەتەڵەوەبوونی ڕێوی و گەلێ قسەوباس و شیعری جوانی بۆخوێندەوە.. ورچە بۆر بەدەم گوێگرتنەوە ژانەسەرەکەی لەبیرکردو خەوی لێکەوت.

بەیانی زوو کە لەخەو هەستا بەچکەی سێیەمی ماچ کردو گوتی:

- بەڕاستی بۆ ژانەسەر هەرئەو دەرمانە بەکەڵکە.. بژی ئەو پێنووس و کتێبەی چارەی ژانەسەر دەکات.



## منداڵ لە بەرهەمی هونەرمەندە جیهانییەکاندا



هونەرمەندی ناسراوو هاودەمی ئەرمەنی **(شاهانیان)** بەم شێوە هونەرییە پڕ لەبەزەیی و ئەڤینەوە هەستی ناسکی خۆی بەرانبەر بەم منداڵە شیرەخۆرە ئەفریقاییەو دایکە هەژارەکەی دەربڕیوەو منیش وەک تابلۆیەکی دەگمەن پێشکەش بەئێوەی خۆشەویستی دەکەم.

**مامتان**
**محەمەد عارف**

## هونەرمەندێکی کەمانچەژەن



قوتابی(هەکاری ستار قادر) قوتابیی پۆلی سێیەمی ناوەندیی دواناوەندیی (کەسنەزان)ی تێکەڵاوەو کەمانچەژەنێکی بەتواناو لێهاتووە، ئێستا ئەندامی کارگێڕی بەشی مۆسیقای (یانەی شەم)ەو ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە، بۆیە بە پێویستمان زانی ئەم پرسیارانەی ئاراستە بکەین.

**پ: ژیانی هونەریت چۆن دەستی پێکرد؟**

و: بەرلەوەی بچمە ناو جیهانی هونەرییەوە ئارەزووی فێربوونی

## شاشەی کۆمپیوتەرو تەلەفزیۆن

**و. لەعەرەبییەوە: ژاڵە خالید سابیر**
**پۆلی چوارەمی ئامادەیی**
**دواناوەندیی (ئەختەر)ی کچان/ هەولێر**
**نیگار: د. ڤانیعە گەلالی**

لەسەرانسەری جیهاندا ژن و پیاو هەتاکو منداڵانیش نزیکەی ٣/٤ی کاتی خۆیان لەبەردەم شاشەی تەلەفزیۆن و شاشەی کۆمپیوتەردا بەسەر دەبەن، ئەمەش لەوانەیە مرۆڤ تووشی چەندین نەخۆشی بکات.



کەمانچەم هەبوو، لە هاوینی ساڵی ٢٠٠٠دا خولێکی فێربوونی مۆسیقا لەلایەن بەڕێوەبەرایەتیی چالاکیی قوتابخانەکانی هەولێر کرایەوە، منیش وەکو قوتابییەک تێیدا بەشدار بووم، مامۆستای زۆر خۆشەویستم (ئالان حەمە فەرەج) ئامێری کەمانچەی فێرکردم.

**پ: کێ هاندەرت بوو؟**

و. بنەماڵەکەم.

**پ: کام لەهونەرمەندان کاریگەریی بەسەرتەوە هەیە؟**

و. مامۆستایان دڵدار زرارو چالاک میرانی.

**پ: دەتوانیت چەند ئامێری دیکە بژەنی؟**

و. ئۆرگ و سەنتوور.

**پ: لەچەند کاری هونەریدا بەشداریت کردووە؟**

و. لەزۆربەی ئاهەنگەکانی چالاکیی قوتابخانەکانی هەولێرو ئاهەنگی کردنەوەی یانەی شەم و ئاهەنگی دەرچوونی خولی هاوینەی قوتابییانی قوتابخانەی (سەرچنار)و ئاهەنگی دەرچوونی خولی مۆسیقای یانەی شەم و چەند چالاکییەکی دیکەدا بەشداریم کردووە.

**پ: حەز لەدەنگی کام هونەرمەند دەکەی؟**

و: عەدنان کەریم.

**پ: هیواو ئاواتی دواڕۆژت؟**

و. ببم بەمۆسیقاژەنێکی بەتوانا بۆ خزمەتی وڵاتەکەم.

**ئا: عیزەدین زەکی زادە**



لێکۆڵەرەوەکان و ئەوانەی سەرپەرشتیی وانەکانی کۆمپیوتەرو ئەو قوتابییانە دەکەن؛ ئامۆژگارییان دەکەن کە دوای سەیرکردنی شاشەی تەلەفزیۆن و کۆمپیوتەر وەرزش بکەن، چونکە ئەوانەی زۆر لەبەردەم شاشەدا دادەنیشن تووشی قەڵەوی دەبن و وەرزش قەڵەوییەکە ناهێڵێ، هەروەها لەنەخۆشییەکانی شەکرەو بەرزبوونەوەی تەوژمی خوێن دەیانپارێزێ.

سەرچاوە: سندباد بغداد ژ/ ٨ ساڵی ٢٠٠٠

ئا: عەبدولڕەحمان مەعرووف
نیگار: ئاریان عەبدولخالیق سەرسام



# خاڵخاڵۆکە



تائێستا نزیکەی چوار هەزار جۆر خاڵخاڵۆکە لە جیهاندا ناسراوە، هەندێکیان زۆر بچووک و هەندێکێشیان هێندەی نینۆکی مرۆڤ دەبن، هەندێک لەوانە تەنیا دووخاڵ لە سەر باڵەکانیاندا هەیەو هەندێکیشیان نزیکەی (٢٢) خاڵی ڕەنگاوڕەنگ (سوور، زەرد، قاوەیی، خۆڵەمێشی) یان هەیە.

خاڵخاڵۆکە بەدرێژایی ڕۆژە ساردەکانی زستان بەکۆمەڵ لە ژێر گەڵای دارو درەخت خۆیان دەشارنەوە، بەهارانیش دەێنەدەرێ، ئەوکاتە زۆریان برسییەو بەدوای خۆراکدا دەگەڕێن، خۆراکیشیان ئەو زیندەوەرانەیە کە زیان بەگوڵ و شینایی دەگەیەنن.

خاڵخاڵۆکە دووجۆر باڵی هەیە؛ یەکێکیان تەنکە بۆ کاتی فڕین و دووەمیش ڕەق و ڕەنگاوڕەنگ و خاڵدارە بۆ خۆپاراستن لە باڵدارو زیندەوەرەکانی دیکە بەکاری دەهێنێ، کاتێک هەست بە مەترسییەکیش بکات شلەیەکی بۆن ناخۆش دەردەدات و خۆیشی بە مردوو نیشان دەدات.

سەری خاڵخاڵۆکە بەسنگییەوە نووساوەو بێ ملە، لە هەرلایەکی سنگیشیدا سێ قاچ هەیە، سکیشی دەکەوێتە دواوەی لەشییەوە، لەشیشی کونی بچووکی تێدایە کە ئۆکسجینیان پێ وەردەگرێ، بۆ جێگەگرتنەوەی دووچاوە کزەکەشی جووتێک قۆچی هەستداری هەیە.

وەرزی زاوزێکردنی خاڵخاڵۆکە لە بەهاردایە، مێیەکان هێلکەی بریسکەدار لە کون و پەناو پەسێوی دارەکاندا دەشارنەوەو دوای حەفتەیەک خاڵخاڵۆکەی لە شێوەی کرمیان لێ دێتە دەرێ، لە حەفتەی دووەمیشدا دەکەونە خواردن و شێوەی خاڵخاڵۆکە وەردەگرن.

سەرچاود: نگاهی از نزدیک بە: کفشروزک /نوسیندە: ماری روبن/ ترجمە: قاسم کریمی/ چاپ سوم ١٣٧٥

# کاوڕێکی گێل

نووسینی: مەحەمەد تەڵەب
و. لەعەرەبییەوە: شیلان یاسین
نیگار: هەژار



کاوڕێک هەبوو لەناو هاوڕێکانیدا لە هەموویان گەورەتربوو بەڵام کەمێک گێل بوو، بەوحاڵەش سەرپەرشتیی کاوڕەکانی دیکەی دەکرد، ئەوانیش خواردنیان بۆ پەیدا دەکردو پاسەوانیشیان لێ دەکرد.



کاوڕەکە ماوەیەک لەسەر ئەو کارە بەردەوام بوو، پاشان هەستی بە بێزاری کرد، ڕۆژێک لەخەیاڵی خۆیدا بیری لەوە کردەوە کەوا بچێتە لای گورگ و قسەی لەگەڵدا بکات، بەرەو لانەی گورگ بەرێ کەوت، لەڕێگادا گورگەکەی بینی کەلەسەر تاشەبەردێک هەڵتووتکابوو و سەیری کۆمەڵە بەرخێکی بەرانبەری دەکرد.

گورگ کە چاوی بەکاوڕەکە کەوت سەری سوڕما.. کاوڕەکە گوتی: گورگی خۆشەویست دەزانم سەرت سوڕماوە، بەڵام من هاتووم ببم بە هاوڕێت، بێگومان هاوڕێیەتیشمان قازانجی هەردووکمانی تێدایە.

گورگ هەروا تەماشای کاوڕە گێلەکەی دەکرد، گوتی: قازانجی چی ؟!

کاوڕەکە گوتی: من دەمێکە سەرپەرشتیی کۆمەڵە کاوڕێک دەکەم، بەڵام لەکارەکەم بێزارم، بۆیە بڕیارم داوە چیتر ئەوکارە نەکەم.

گورگ بە لەخۆباییەوە گوتی: جا بە من چی ؟!

کاوڕەکە گوتی: چۆن بەتۆچیی ؟! من گەورەو پاسەوانیانم، گەر من و تۆ لەگەڵ یەکتری ڕێک بکەوین و تۆش بەڵێنم پێ بدەیت کە نەمخۆی؛ ئەوا من ڕازی دەبم بەوەی هەموو کاوڕەکان بخۆی و ڕێگات لێ ناگرم.

گورگ بەم قسەیە زۆر تێکچوو، بۆیە بەتووڕەییەوە پێی گوت: تۆ ناتوانیت ڕێگام لێ بگری، بەڵام تۆ کە وەفات بۆ هاوڕێکانت نەبێ؛ چۆن وەفات بۆ من دەبێ ؟

بۆیە ددانەکانی لێ تیژکردو پری دایێ و خواردی.

سەرچاوە: گۆڤاری (العربي الصغير) ژ/ ٩٦ ئەیلوولی ٢٠٠٠ ل ٥٢ (بەدەستکارییەوە)

# ڕازی

# قەڵەم و دەفتەر




دەفتەر : برام پشت و پەناتم
جێی نهێنی و بڕواتم
دڵ لە دڵ نەدەی برا
تۆ (مۆم) یت و من (چرا)

قەڵەم : دڵت سپی و بێگەردە
پایەت بەرزو بڵندە
مەرج بێ هەتاکو ماوم
بۆ تۆ بێ هێزو تاوم

دەفتەر : من پەڕەی دڵ، تۆ باڵات
بۆ خوێندن ئەکەین خەڵات

قەڵەم : تۆش باوەڕت وەک منە
ئیمانت بە خوێندنە

دەفتەر : قەڵەم هاوڕێی شیرینم
هاوڕێی کۆن و دێرینم
بێ تۆ حەز لەهیچ ناکەم
لەهیچ شوێنێ هەڵناکەم

قەڵەم : ئێمە هەردووک یەک دڵین
بۆ باخچەی نووسین گوڵین
شەو و ڕۆژ دەست لەملانین
هاوڕێی خوێندەوارا نین

دەفتەرو قەڵەم (پێکەوە):
هەردووک بەدڵ و بەگیان
هەنگاو دەنێین بۆ ژیان


هۆنراوەی: ئەحمەد سەلام
نیگار: دارا محەمەد عەلی

# قەلەم

هۆزانا:
ئازاد مزویری

نیگار:
هیوا عەزیز




قەلەم تو خودان هێزی
ل دەف مەیێ برێزی
قەیدو زنجیر خەلەکن
ل دۆراتە گەلەکن
بنڤیسە ب سەربەستی
چ جا نە بە ژێر دەستی
پەیاما خوە بەلاڤکە
بێن کورە خودان چاڤکە
بنڤیسە پەیڤێن ژینێ
راچینە تەڤنێ ڤینێ
ژێیێ تە پڕ درێژە
برینا ڤە برێژە
ب کەلکی بۆ مرۆڤا
نەکەڤیە دەستێ هۆڤا

دۆرا: دەوروبەر
تەڤن: تەون
ڤە برێژە: برژانەوە
هۆڤ: دڕندە

# پشەو جووجەڵە

هۆنراوەی: عەلی بەختەوەر
نیگار: ئاریان عەبدولخالیق سەرسام

مەمخۆ .. مەمخۆ پشیلە
منی جوان و وردیلە
گەر بمخۆی لە ناکاوا
دایکم دەمرێ لە تاوا
ڕەشپۆش دەبن خوشکانم
دەژاکێن براکانم
دەوروبەر لێت دەتۆرێ
لەتاوانت نابوورێ
دەی لاچۆ لەبەرچاوم
من بۆ تۆ نەخولقاوم
دەمەوێ ئازاد بژیم
دڵشادبم، هەرگیز نەگریم
بەئاشتی و پێکەوە ژیان
خۆش و شیرینە جیهان



هەولێر ٢٠٠٣/٩/١٤

١٦

# سمۆرەکە چی بینی؟!

و. لەفارسییەوە: مەهناز حاجی    نیگار: د. ڤانیعە گەلالی

ڕۆژێک لەڕۆژە گەرمەکانی هاوین مارێکی بچکۆلانە دوای ئەوەی کە تێرو پڕ خواردنی خوارد، بەدوای جێگایەک گەڕا تاپشوویەک بدات، پاشان بەگیاو گۆڵ جێگایەکی نەرمی بۆ خۆی دروست کردو خەوێکی خۆشی لێکەوت.

سمۆرەیەک لەسەردار تەماشای مارەکەی دەکرد کەچۆن لەبەر هەتاو ڕاکشاوە، لەبەر ئەوە دەستی بەقیژە قیژکرد.

ڕاوچییەک لەم ناوە نزیک بووەوە، گوێی لەدەنگە دەنگەکە بوو، کە چووە نزیک دارەکەو مارەکەی بینی؛ بیری کردەوەو گوتی: ئەم مارە بەکەڵکی من نایەت، ئەگەر بیکوژم و بیبەمەوە ژنەکەم سوپاسیشم ناکات.

ڕاوچییەکە ڕۆیشت، سمۆرەکە دیسان دەستی بەقیژە قیژ کردەوە، ئەوجارە ڕاوچییەکی تر بەرەو دەنگەکە چوو، بەڵام کە چاوی بە مارەکە کەوت لەبەر خۆیەوە گوتی: ئەم مارە ئازاری نییە، نایکوژم.

مارێکی گەورە کەخۆی لەژێر تاشە بەردێکی گەورەدا شاردبووەوە، گوتی: دیارە لەجێی ئەم مارە بچکۆلانەدا جادوویەک هەیە، بابچم بۆ خۆم لەو جێگایە درێژبم، لەوێ کەس کاری بەمن نییە.

مارە گەورەکە مارە بچکۆلانەکەی دەرکردو بۆ خۆی لەجێگاکەیدا پاڵکەوت..

ئەمجارەیان سمۆرەکە لەجارەکانی پێشوو زیاتر دەستی بەقیژەقیژ کرد، ڕاوچییەکی دیکە خۆی گەیاندە دارەکەو چاوی بەمارە گەورەکە کەوت یەکسەر کوشتی.

سمۆرەکە کە ئەمەی بینی گوتی: ئەوە بۆ من دەرسێکی گەورە بوو، تێگەیشتم مەرج نییە جێگایەک بۆ گیانلەبەرێک خۆش و هێمن بێت؛ بۆ گیانلەبەرێکی دیکەش ئاوا خۆش و هێمن بێت، دەبێ ئاگام لەخۆم بێ تا بەتەڵەی ڕاوچییەکەوە نەبم.



سەرچاوە: افسانەهای آفریقا

١٧

# فیل و ماڵی مام گورگ

و. لەئینگلیزییەوە: شاهناز
سیناریۆ: دڵخواز مستەفا
نیگار: پەخشان گەلالی


















# جامی ڕەوشتبەرزی

نووسینی: زاگرۆس
نیگار: ساڵح مەهدی



لەقوتابخانەیەکی سەرەتایی تێکەڵاودا بەڕێوەبەرو مامۆستایانی قوتابخانە بڕیاریاندا گەشتێک بۆ هاوینە هەوارەکانی کوردستان ساز بکەن، بەقوتابییەکانیان ڕاگەیاند ئاگاداریی دایک و باوکیان بکەن.

ڕۆژی هەینی گەشتەکە دەستی پێکرد، بەگۆرانی و چەپڵەڕێزان و نوکتە گەیشتنە شوێنی مەبەست.

پاش پشوودان بەڕێوەبەر قوتابییەکانی کۆکردەوە، گوتی ئێستا پێشبڕکێیەک ساز دەکەین، خەڵاتی یەکەم و دووەم و سێیەم ئامادە کراوە.

پێشبڕکێ دەستی پێکرد، دوو مامۆستا لەپێشەوەی قوتابییەکان و دوو مامۆستاش لەدواوەیان بەهێمنی ڕایاندەکرد بۆ ئەوەی پارێزگاریی قوتابییەکان بکەن.

کاکە حەمە یەکێک بوو لەو قوتابییانەی بەشداریی پێشبڕکێکەی کردبوو، ئەو سەرەتا زۆر لەسەرخۆ ڕایدەکرد، چاوی بەهەڵوێست کەوت، گوتی کاکە هەڵوێست ئەوە بۆ دانیشتووی و ڕاناکەیت؟

ئەویش گوتی قاچم ئازاری پێگەیشتووە.. کاکە حەمە لە دڵی خۆیدا گوتی گیانی هەڵوێستی هاوڕێم لەلای من گرنگترە لەجامێک ئەگەر ئەو جامە لەزێڕیش دروستکرابێت، بۆیە یەکسەر ئاگاداری مامۆستای کردەوە، هەردووکیان بەیەکەوە چارەسەریی هەڵوێستیان کرد.

پێشبڕکێ بەردەوامە، پاش ماوەیەکی کەم کاکە حەمە بینی هێمن سەری خۆی گرتووە، پێی گوت کاکە هێمن چی ڕوویداوە؟

هێمن گوتی بەربوومەوەو سەرم بەبەردێکی گەورە کەوتووەو زامدار بوومە، بەهەمان شێوە کاکە حەمە مامۆستای ئاگادار کردەوەو بەیەکەوە زامی هێمنیان تیمار کرد.

پێشبڕکێ بەردەوامە، کاکە حەمە بڕوای تەواوی هەبوو کە خەڵات بەدەست ناهێنێ، بەڵام لەهەمان کاتدا دڵخۆش بوو کەیارمەتیی





هاورێکانی دابوو.

سەرەنجام سێ قوتابی پلەی یەکەم و دووەم و سێیەمیان بەدەست هێنا، بەڕێوەبەر قوتابییەکانی کۆکردەوە بۆ ئەوەی خەڵاتەکان دابەش بکات، لەناکاو ماموستا پەرواو ماموستا هاوڕێ بە بەڕێوەبەریان گوت: بەڕێز ڕاستە ئەم سێ قوتابییانە لەپێشبڕکێ سەرکەوتوون، بەڵام کاکە حەمە خۆی کردە یارمەتیدەری گیانی بەگیانی هاورێکانی و توانی هەڵوێست و هێمن ڕزگار بکات، لەوانەبوو ئەگەر وای نەکردبووایە ئەنجامێکی باشی لەپێشبڕکێکە بەدەست بهێنایە.

بەڕێوەبەری قوتابخانە بەوکارە پیرۆزەی کاکە حەمە زۆر دڵخۆش بوو، بۆیە هاتە ئاخاوتن و گوتی: بەڕاستی قوتابخانەو زانست و ڕەوشت شتی پیرۆزن، کاکە حەمەش لەو پێشبڕکێیەدا خۆی بێبەش کرد، بەڵام ئەم قوتابییە ژیرو خۆنەویست و ڕەوشتبەرزە بڕوای بەیارمەتی و هاوکاری و گیانی وەرزشی هەیە، بڕوای بەخۆشەویستیی کۆمەڵ و وڵات و قوتابخانەو هاوڕێ هەیە، هەموو ئەم کارانەشی ئەنجامدا لەپێناو دەربازکردنی هاوڕێکانی.. ئومێدەوارم سەرجەم قوتابییان و منداڵانی کوردستان وەکو کاکە حەمە بیربکەنەوە، بەم بۆنەیەوە لەم گەشتە خۆشەدا من و سەرجەم ماموستایان بڕیارماندا خەڵاتێک پێشکەش بەکاکە حەمە بکەین، ئەویش جامێکە بەناوی (جامی ڕەوشتبەرزی).



# نەخۆش



نووسینی: شاخەوان عەلی حەمەد
نیگار: دڵشاد عەلی



نەسرین کتوپڕ تووشی ڕشانەوە بوو و بەهۆی نەخۆشییەکەوە چەند ڕۆژێک لە قوتابخانە دابڕا.. هێرۆ بەقوتابییەکانی پۆلەکەی گوت: نەسرین نەخۆشەو لەناوجێ کەوتووە، من دوێنێ ئێوارە چوومە سەردانی، پرسیاری یەکە یەکەتانی کرد، ئەرێ ئێوە دەزانن نەخۆش حەز دەکات سەردانی بکرێ؟

هەموو بەیەک دەنگ گوتیان: بێگومان قسەکەت ڕاستە. پاشان بڕیاریاندا لەناوخۆیاندا هەندێک پارە کۆبکەنەوەو بووکێکی جوانی پێ بکڕن، ئەوجا چەند کەسێک بەناوی سەرجەم قوتابییانی پۆلەکەوە بچنە سەردانی و دیارییەکەیشی پێشکەش بکەن.

بێریڤان و مێرەم و گەشاو دوای دەوام چوونە بازاڕو بەدەست ودیارییەوە چوونە سەردانی، کاتێک دانیشتن و لە هەواڵیان پرسی؛ بێریڤان بەهێمنی بووکەکەی لەبەردەم داناو بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی: ئەمە دیاریی سەرجەم قوتابییانی پۆلەکەمانەو هەموویان لەهەواڵت دەپرسن. نەسرین بەبزەیەکی گەشەوە گوتی: ئەو ئەزیەتەی نەدەویست، هاتنی ئێوە بۆ ئێرە هەموو شتێکە.

ماوەیەک بەیەکەوە دانیشتن و قسەی خۆشیان کرد، بێریڤان ڕووی کردە مێرەم و گەشاوو گوتی: ئەرێ کاتی ئەوە نەهاتووە هەڵسین بڕۆین تاکو ....) نەسرین قسەکەی پی بری: تاکوچی؟! بۆ وا بەپەلەن؟ بەڕاستی بەهاتنتان دڵخۆش بووم بەڵام هێشتا زووە.

بێریڤان بەزەردەخەنەوە گوتی: نابێ نەخۆش بەزۆر مانەوە بێزار بکرێ، تۆش نەخۆشیت و پێویستیت بەپشوودانە.. پێکڕا هەڵسانە سەرپێ، گەشاو بەنەسرینی گوت: نەسرین گیان هیچ خەمی دەرسەکانت نەبێ، کە چاک بوویتەوە چیمان خوێندووەو ئەوەی دەیخوێنین دووبەدوو لەگەڵت دادەنیشم و هەموویت پێ دەڵێمەوە.

ئینجا یەکە یەکە تەوقەیان لەگەڵ نەسرین کردو هیوای چاکبوونەوەیان بۆ خواست.

# شووتی



هۆنراوەی: فاتیمە محەمەد ئەحمەد
نیگار: دلشاد عەلی

میوەیەکی هاوینم
زۆر بەتام و شیرینم
خواردنی من زۆر خۆشە
شیفای هەندێ نەخۆشە
سوورم وەک گوڵی بەهار
لە لادێوە دێم بۆ شار
ناوکیشم سپی و ڕەشە
بەرگم سەوزێکی گەشە
من دراوسێی کاڵەکم
خۆراکێکی بە کەڵکم

# داپیرە



هۆنراوەی: هودا جەلالەدین
نیگار: عەلی دەروێش

ئەی داپیرەی قسە خۆش
بڵێ چیرۆکی بە جۆش
گشت لە دەورت بێ دەنگین
گوێ بۆ وەتەن ڕادەگرین
فێرمان دەکەیت ڕاستگۆ بین
تا هەین، دوور لە درۆ بین
ئێمەش هەموو نەوەی تۆین
بە ڕێگای دروست دەڕۆین
هەردەم تۆ لە یادمانی
ڕەوشت بەرز، بە ویژدانی
داپیرە سوپاس بۆ تۆ
خۆشیت گرتووەتە ئەستۆ

## دۆزینەوەی وشەی بزر

ئا: پشتیوان کەریم

خۆشەویستەکانم، دوای دۆزینەوەی ناوی ئەم وانە خۆشانەی کە لە قوتابخانە دەیانخوێنن. (٥) پیت دەمێننەوە، چۆن دەتوانن ناوی وانەیەکی خۆشیان لێ دروست بکەن کە لە گۆڕەپان ئەنجام دەدرێ؟
(کوردی، عەرەبی، ئینگلیزی، بیرکاری، مێژوو، جوگرافیا، ئایین، سروود)

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ج | و | گ | ر | ا | ف | ی | ا |
| ب | یـ | ر | ک | ا | ر | ی | م |
| ش | ک | و | ر | د | ی | ر | ێـ |
| و | ع | ه | ر | ه | ب | ی | ژ |
| | س | ر | و | و | د | ه | و |
| ئـ | ا | یـ | یـ | ن | ز | | و |
| ئـ | یـ | ن | گ | ل | یـ | ز | ی |

شیکار

## نیشانە دانان

ئا: جوان فەرهاد گەلاڵی

نیشانەی (✔) بەرانبەر ڕستە ڕاستەکان و نیشانەی (×) بەرانبەر ڕستە هەڵەکان دابنێ و پاشان هەڵەکان ڕاست بکەوە:

☐ لە ڕۆژی ٤/١٠/١٩٩٢ پەرلەمانی کوردستان دامەزراوە.

☐ هەولێر پایتەختی کوردستانە.

☐ ڕەنگەکانی ئاڵای کوردستان بریتین لە: سوور، سپی، زەرد، سەوز.

☐ گۆڤاری (هەنگ) گۆڤارێکی کۆمەڵایەتییە.

☐ ١/ی حوزەیران ڕۆژی جیهانیی منداڵانە.

## ڕێگا دۆزینەوە

ئا: مەهاباد خەلیل




ئەم کچە بە کام ڕێگا دەتوانێت بچێت بۆ قوتابخانە؟

# کاتێکی خۆش

## نیگار ڕەنگکردن

ئا: ڤینا



ئەم نیگارە ڕەنگ بکە:

## بۆ پێکەنین

ئا: کەمال عەبدوڵڵا حەسەن



• **چیرۆکی شێتەکان**

دوو شـێـت لەناو باخـچـەی نەخـۆشـخـانەیەکـدا هاتوچۆیان دەکـرد، لەناکـاو یەکـێکیـان چاوی بە سـەگـێک کەوت، بەرەولای چوو و زۆر بەڕێزەوە خۆی چەماندەوەو گـوتی: سـلاوت لێ بێ کـاکی فیل! شێتەکەی تر دەستی ڕاکێشاو گوتی: چەند گێلی خۆ ئەمە فیل نییە.

شـیـتەکـە وەلامی دایەوە: دەزانم، ویستم گـالـتـە بەم ئەسـپـە بکەم!

• **دکتۆری شارەزا**

پیـاوێـک لە سـەرەمـەرگ دابوو، دکـتـۆر هاتە سـەری و زۆر بەوردی پشکنی، دوای کـەمـێـک دکـتـۆر ڕووی لە هاوسـەری پیاوەکە کردو گوتی:

بەداخەوە پیاوەکەت مردووە!

نەخۆشەکە هێشتا نەمردبوو، گوتی: نا... نا... من نەمردووم.

ئافرەتەکە بەتووڕەییەوە ڕووی لە پیاوەکەی کردو گوتی: وس بە! وا دەزانی دکـتـــۆر گـێـلەو بەقـــەد تۆ نـازانێت!




## خوێندن و زانیاری

هۆنراوەی:
کلارا محەمەد ئەمین حەسەن
پۆلی شەشەمی سەرەتایی / شەقلاوە

ئێمە منداڵی کوردین
دەخوێنین تاکو دەمرین
پەپوولەین، دەروون پاکین
زیت و ژیرو چالاکین
بۆ زانیاری پەرۆشین
لەدەریاکەی دەنۆشین
بەخوێندن و زانیاری
گشت دەگەین بەهۆشیاری
بەردەوام هەوڵ دەدەین
تا کوردستان پێش بخەین
پێویستە گشت بخوێنین
تۆوی زانست بچـــێنین



بەسۆز حامد محەمەد عەلی
پۆلی سێیەمی سەرەتایی
قوتابخانەی (دڵی کوردستان) - هەولێر





سۆران عەبدولقادر عەبدوڵڵا
تەمەن: ١٤ساڵ

## پێنج جیاوازی

ئامادەکردن و نیگار:
مستەفا ئازاد مستەفا

پۆلی شەشەمی سەرەتایی
قوتابخانەی (بەختیاری) - هەولێر





## ٢٥

# یارمەتیی پێویست دەدەم نەک هی درۆزن

نووسینی: ئیدریس عەبدوڵڵا
نیگار: عەلی دەروێش




پشیلەیەکی داکانەو دوو لە بێچووەکانی لەکونێکی خۆش دەژیان، ئێوارەیەکیان لە دەرگایان درا، کە کردییانەوە بینییان پشیلەیەکی هاوڕەگەزی خۆیان بوو... پشیلەکە گوتی: لێم قەوماوە، داواکارم ئەمشەو یارمەتیم بدەن و لای خۆتان جێگەم بکەنەوە.

بێچووە پشیلەکان بەزەییان پێدا هاتەوە، بەڵام دایکیان دەرگای بەڕوودا داخست و گوتی: شوێنمان نییە.

پاش ئەمە بەماوەیەکی تر دیسان لە دەرگا درایەوە، ئەمجارە کە کردیانەوە، بینییان دوو پشیلەی دیکەن، ئەوانیش داوای یارمەتییان کردو گوتیان: لەم ناوچەیە میوانین و شوێنێک شک نابەین، بۆیە ئومێدەوارین ئەمشەو جێگامان بکەنەوە.

ئەمجارە پشیلە دایکانە بەڕوویەکی خۆش فەرمووی لێکردن و جێگەی بۆ کردنەوە تا بەیانی لای ئەوان بحەسێنەوە.

ئەمە دوو بێچووە پشیلەکەی سەرسام کرد! هەر تەماشای یەکتریان دەکردو نەیاندەزانی لەبەرچی دایکیان پشیلەکەی پێشووی دەرکرد، گوتی جێگەمان نییە، کەچی ئێستا چۆن پێشوازیی لەم دوو پشیلانە کردو بەم شێوەیە کردنییە ژوورەوە!

ئەو شەوە تا بەیانی ئەم پرسیارە لەمێشکی دوو بێچووە پشیلەکان دەرنەچوو، بۆیە بەیانی کە میوانەکانیان ڕۆیشتن؛ دوو بێچووە پشیلەکان بەڕێزەوە ڕووی پرسیارەکەیان کردە دایکیان و پێیان گوت: لەبەرچی ڕێگەی پشیلەی یەکەمت نەداو دەرتکرد، کەچی دواتر دەرگات بۆ دوو پشیلەکانی تر کردەوە؟!

پشیلە دایکانە وەڵامی دانەوە: ڕۆڵەکانم پشیلەی یەکەم درۆزنە، شوێنی هەیە بەڵام دەیەوێت بەسەر خەڵقەوە بژی، بەڵام دوو پشیلەکانی تر ڕاستیان دەکرد، هی ئێرە نەبوون و میوان بوون، بۆیە ئەرکی سەرشانمان بوو یارمەتییان بدەین و دەرگایان بۆ بکەینەوە.. لەبەر ئەوەبوو پشیلەی یەکەمم دەرکردو دوو پشیلەکانی تریشم لای خۆمان گلدایەوە، چونکە من یارمەتیی خەڵکی پێویست دەدەم بەڵام یارمەتیی درۆزن نادەم.

# پێشبڕکێی ئازیزان

**ژمارە (١)**

**ئازیزەکانم:**

لەمەودوا بۆ هەر ژمارەیەک دوو پرسیار ئامادە دەکەین، لە دوای تیروپشک لە نێوان خاوەن وەڵامە ڕاستەکاندا ناوی ئازیزێک دەردەچێ و دەبێتە خاوەن خەڵات کە بریتییە لە:

١- کاسێتێکی تۆمارکراوی هەڵبژاردەی گۆرانیی منداڵان.

٢- CD یەکی دەنگ و ڕەنگ (گۆرانیی منداڵان).

خاوەن خەڵات یەک لەم دووخەڵاتە هەڵدەبژێرێ کە لە تۆمارگەی (جیهانی گۆرانی) یەوە تەرخان کراوە کە خاوەنەکەی (باوکی گلارا) یە.

پرسیاری یەکەم/ شارێکی کوردستانی ڕۆژهەڵاتە، لە سێ پیت پێکهاتووە:

١- یەکەم پیتی وشەی (شانە)یە.

٢- یەکەم پیتی وشەی (نیگا)یە.

٣- دووەم پیتی وشەی (مۆم)ە.

ئەم سێ پیتە لێک بدەو شارەکەت بۆ دەردەچێ.

پرسیاری دووەم/ ئەم لاکێشەیەی خوارەوە (٩) لاکێشەی تێدایە، تۆش(٩) ژمارەت هەیە، لە ژمارە (١) هەتا ژمارە (٩) لەناو خانەکان دابنێ بەمەرجێک هیچ ژمارەیەک دووبارە نەبێتەوە، لەسەرەوە بۆ خوارەوەو لەڕاستەوە بۆ چەپ و لە گۆشەوە بۆ گۆشە هەمووی کۆبکەوە بکاتە (١٥).

**تێبینی: وەڵامەکان لەگەڵ ئەم کۆبۆنەدا دەنێردرێن**

| | | |
|---|---|---|
| | | |
| | | |
| | | |

**کۆبۆنی پێشبڕکێی ئازیزان**
**ژمارە (١)**

ناو:

پۆل یان تەمەن:



**ئاو سەرچاوەی ژیانە**
**بەفیڕۆ دانی زیانە**
**من ئاو بەفیڕۆ نادەم**
**نەمامی گوڵ ئاو دەدەم**

ئەم دوو دێڕە شیعرە پێشکەشە بەم منداڵە جوانە (ئەحمەد عومەر فەقۆ).

**کازم کۆیی**